# بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله قبل كل كلام الحمدلله رب العالمين لأن الحمد لله فى الأولى

والآخرة وصلَّى الله على نبينا محمد وعلى ال واصحابي : اما بعد ...

---

# پـێـــشـــەكـــی

## خەوی ئیماندار

بەپێویستم زانی کە کورتە باسێک لە سەر (خەو) الرؤیا بکەم , وە چیە و چۆنە و تعبیر و أحکامەکانی بەکورتی چونکە ئەبینم ، سبحان الله خەڵک زۆرینەی لەم شتەش هــەر بێ ئاگایە و نەشارەزایە لەکاتێکدا الرؤیا المؤمن بەشێکە لەچەندان بەشی پێغەمبەرایەتی کە باسیان ئەکەم وە زۆریش ترسناکە گەر بێت و شارەزایــــیت لێی نەبێت کە هــۆکـــاری ترسناکیەکەشی باس ئەکەم پشتیوان بە الله هۆکارەکەش نەزانین و بێ ئاگایی خــەڵک بەگشتی ئیماندارانیشە بەتایبەتی لەدین و شرع دا الله تعالى لە قورئان بە رســـول الله صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت( وقل ربی زدنی علما ) لەکاتێکدا عالمترین کەســیش بوە کەواتە ئەبێت خۆمان فێری علم بکەین بەرێگەیەکی رێک و رێگەپێدراو و لەسەر رێـــچکەی خیر القرون

خەوی ئیماندار وەك لە صحیح بخاری داهاتوە رسول الله ، دەفــەرموێت: ( لم يبق من النبوة إلا المـــبشرات قـــيل وما المبشرات قـــال الرؤيا الصـــالحة يان الرؤيا المؤمن)

واتە : هــــیـــچ شـــتـــێ نـەمــاوە لە پێــــغەمبــەرایــەتـی بۆ خـەڵک واتە :خاتم . النـبوە بە مـــحمد الأمین کـــۆتایی هاتوە ئەوەی ماوە خــــەوی چاکـــی ئیماندارانە ،

وەك أنس بن مالك رضي الله عنه دەڵێت :

رسول الله فەرمووی خەوی ئیماندار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی. صحيح البخاری

بێگومان خەوی ئیماندار یەکێکە لەنیشانەکانی پێش هاتنی قیامەت وەک أبو هریره دەڵێ رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرمووی : کاتێ قیامەت نزيك ئەبێتەوە خەوی ئیماندار درۆ دەر ناچێت. صحیح، بخاری، صحیح ابن حبان بۆیە ئیـــمـــانـدار ئەبـێت گرنگی بەم باســە بدات احکامەکانی بزانێ هەر هیچ نەبێت کەمێکی لـــێ بزانێت لێ زانینەکەش نەک وە تعـــبير کردن چونکە تعبير يان لێکدانەوەی خەو زۆر قـورسە زۆر کەم کەس لێی ئەزانێت وەجگە لەمەش فضل الله یە بەکێی بوێت ئەیدات ئـــەمەشیان باس ئەکەین پشتیوان بە الله .

نوسینی : لیکولەر ابی عبدالله کوردستانی

# خەوی ئیماندار بەشێکە لە بەشەکانی پێغەمبەرایەتی

لەچەند فەرموودەیەکی صحیح کە لەزۆرینەی صحیح وسنن و مسندەکان هاتوە بەڕیواتی جیاواز باس لەوە ئەکات کە خەوی ئیماندار ( الرؤیا المؤمن) بەشێکە لەبەشــەکانی نبوة واتە : پێغەمبەرایەتی کە ماوە ئێستا وە یـــەکەم هەنـــگاوی وەحـــی بۆ رســـول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لــە رێـــگـــەی خـــەوەوە بـــووە وەك لە دایکمان عائیشەوە الله لێی ڕازی بێت :

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا قَالَتْ : أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْوَحْيِ، الرُّؤْيَا الصَّادِقَةُ فِي النَّوْمِ، فَــكَانَ لَا يَرَى رُؤْيَا إِلَّا جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّــبْحِ .

واتە : سەرەتایی وەحی بۆ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەرێگەی خەوەوە بو خەوی چاك لە كاتی نوستن دا وە هــەر خــەوێکــی بینیبایە وەك رۆژی ڕوونــاك ڕووی ئەدا .

صحیح ، بخاری ، مسلم

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ :

الرُّؤْيَـا الْحَــسَــنَــةُ مِنَ الرَّجُــلِ الصَّــالِــحِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَـعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ

صحیح مسلم ، بخاری ، ابن حبان ، مسند أحمد

ئەم فەرموودە کۆمەڵێك هاوەڵ ڕیوایەتیان کردووە وەك أنس بن مالك و عبدالله بن عمر و عبادة بن الصامت کە رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت : خەوی چاك لە پیاوی باش بـــەشـــێـــکـــە لــە چـل و شـەش بـــەشــی پــێــغــەمــبــەرایـــەتـی .

لەهەندێ ڕیواتە دەڵێ چل و حەوت و لەهەندێ دەڵێ حەفتا .

کەواتە لەم فەرموودانە بۆمان دەرەکەوێت کە خەو چەند گرنگە واتە خەوی ئیماندار چونکە بەشێکە لە بەشەکانی پێغەمبەرایەتی .

# دوای نەمانی پێغەمبەرایەتی

لەچەندان فەرمووودەی مرفوع و صحيح هاتوە كەوا دوای پێغەمبەرایەتی هیچ شتێک نامێـــــنێــت تـــەنها خـــەوی ئـــیمـــانـــدار نـــەبێــت وەك لەم فەرمووودانە.

أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ : لَمْ يَبْـــقَ مِنَ النُّبُـــوَّةِ إِلَّا الْمُبَشِّرَاتُ ". قَالُـــوا : وَمَا الْمُـــــبَشِّرَاتُ ؟ قَـــالَ : " الرُّؤْيَا الصَّـــالِحَـــةُ ". صحيح البخاری

واتە : هـــیـــچ شتێــك نەماوە لە رســـالە و پێغـــەمبەرایەتی جـــگە لە مـــبشرات

گـــوتـــیـــان : مـــبشـــترات چـــیـــیە ؟ فەرمووی : خـــــەوی چـــاكــــــەیـــە .

وە هەروەها لە صحيح إبن حبان هاتوە بە اسنادی درووست

ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَشَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ السِّتَارَةَ فِي مَرَضِه الَّذِي مَاتَ فِيه وعن َالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ: « إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ ، يَرَاهَا الْمُؤْمِنُ أَوْ تُرَى لَهُ .

واتە : إبن عباس اللە لێی ڕازی بێت دەڵێت : رسول اللە صلى اللە علیە وسلم پەردەی هەڵداوە لە كاتی نەخۆشی سەرە مەرگ دا وە خەڵک ڕیز بوون دوای ئەبوبكر فەرمووی : هیچ شتێک نەماوە دوای پێغەمبەرایەتی وەك وەحی تەنیا خەوی چاكە نەبێت كە ئیماندار ئەیبینێت و یان پێوەی ئەبینن .

ئەم فەرمووودانە گەورەیی خەوی ئیمانداران بۆدەرەخات كە جێگای بایەخە چونكە لەڕێگەی خەووە إلهامی هەندێك مسائیل و پێشهات ئەزانرێت .

# خەوی خۆش و ناخۆش

خەوی ئیماندار دوو بەشی سەرەکین

کە خۆشەکەی پێی دەڵێن الرؤیا وە ناخۆشەکەی پێی دەڵێن الحلم .

جۆری یەکەمیان لە الله وە وە جۆری دووەمیان لە شیطانەوەیە .

وەك لەم فەرموودەیی صحيح البخاری و مسلم هاتوە :

أَبَا سَلَمَةَ قَالَ : سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " الرُّؤْيَا مِنَ اللَّهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ .

واتە : خـەوی خـــۆش و چـــاک لە الله وەیـــە ، خــــەوی ناخۆش لەشـــيطانەوەيە .

کە دواتر باس ئەکەین لە کاتی خەوی خۆش چی بکرێ و لە کاتی بینینی خەوی ناخۆش چ شتێکی خەو وەستاوە تا کاتی باس کردنی کاتێ خەوێك ئەبینرێت ئــەم خەوە معلـــق ئـــــەبێت لەســـەر ســـەری خـــاوەنەکەی تا ئەم کاتەی کە باس ئــــەکرێت .

وەک لەم فەرمودەی کە اْبن حبان هێناویەتی :

اخبرنا محمد بن عبداللّه بنِ الْجُنَيْد، قَالَ: حَدّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدّثَنَا هُشَيْمٌ، حَدّثَنَا يَعْلَى بْنُ عَطَاءٍ، عَنْ وَكِيعِ بْنِ حُدُسٍ، عَنْ عَمّهِ أَبِي رَزِينٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: «رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوّةِ، وَالرُّؤْيَا عَلَى رِجْلِ طَائِرٍ مَا لَمْ يُعَبّرْ عَلَيْهِ، فَإِذَا عُبّرَتْ وَقَعَتْ» قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: «لاَ يَقُصُّهَا إلاّ عَلَى وَادّ أَوْ ذِي رَأْيٍ» قَالَ أَبُو حَاتِمٍ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ: الصّحِيحُ بِالْحَاءِ كَمَا قَالَهُ هُشَيْمٌ، وَشُعْبَةُ وَاهِمٌ فِي قَوْلِهِ «عُدُسٍ» فَتَبِعَهُ النّاسُ ، صحيح لغيره

واته : خەوی ئیماندار بەشـــێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی ، وە خەو لەسەر خـــاوەنەکەی ڕائەوەســـتێت تا ئەوکاتەی ئەی گێڕێـــتەوە کە باسی کرد ڕووئەدات .

مەترسیە کە لێرەدایە !!! کاتێ یەکێک خەوێک ئەبینێت بێ گوێدانە ئەوەی کێ بێت و کێ نەبێت باسی ئەکات لە فەرموودەکان پێمان گووتراوە کە تەنها لای خۆشەویستان و کەســـانی شارەزا نەبێـــت نەی گێــڕینەوە . کە ئەمیش باس ئەکەم ا ن شاء الله تعالى .

# له كاتی بینینی خەوی خۆش و ناخۆشدا

ئەمە یەکێکە لە باسە گرنگ و مەترسیدارەکان کە زۆربەی لێی بێ خەبەرن و نایزانن تەنها کەمێک نەبێت ئەمیش لەکاتی بینینی خەوی خۆش یان ناخۆشدایە

## یەکەم : لەکاتی بینینی خەوی خۆشدا

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ :

" إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ رُؤْيَا يُحِبُّهَا، فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ اللَّهِ، فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ عَلَيْهَا، وَلْيُحَدِّثْ بِهَا "

صحيح، بخاری، سنن الترمزی

واتە : هەریەك خەوێکی بینی لە ئێوە خۆش بوو بە دڵــی بوو ئەوا لە لایەن الله وەیە با ســـوپاســی الله ی لــەســەر بــکــات وە بیــگـرێــتەوە .

وە لەم فەرموودەیە ش :

أَبَا قَتَادَةَ يَقُولُ : سعت النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ :

" الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ مِنَ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يُحِبُّ، فَلَا يُحَدِّثْ بِهِ إِلَّا مَنْ يُحِبُّ "

واتە : خەوی چاک و خۆش لە الله وەیە گەر هەر یەک لە ئێوە خەوێکی خۆشی بینی با باســی نەکــات تــەنیــا لای کەســانـێـک کە خۆشـی ئەوێــن .

ئەمە فەرموودەیەکی صحیحە کە لە زۆربەی سنن و مسندەکان دا هاتوە وە لە صحیحین

واتە : لە بخاری و مسلم یش واردە .

## لەم فەرمووادانە ئەوەی فەرمان کراوە :

1 ) خـەوی خۆش لە کاتی بینینی ئەبێـت باس بکرێـت بۆچـی؟ چونکە کە باس کرا ڕووئەدات وەک لەباسێک پێش ئێستا باسم کرد کە معلق ئەبێت تا کاتی باس کردنی .

2) نابێت ئەم باس بکرێ تەنها لای ئەو کەسانە نەبێت کە خۆشت ئەوێن و نزیکن لێتەوە بۆچی ؟ وەک لە فتح الباری ابن حجر دەڵێت :

أن الحكمة فيه أنه إذا حدث بالرؤيا الحسنة من لا يحب قد يفسرها له بما لا يحب ؛ إما بغضا وإما حسدا، فقد تقع عن تلك الصفة، أو يتعجل لنفسه من ذلك حزنا ونكدا، فأمر بـــتـــرك تـــحـــديـــث مـــــن لا يـــحـــب بـــســـبـــب ذالـــــك .

واتە : حیکمەت لەم شتە چونکە تفسیرێکی هەڵە و وای بۆ ئەکات کە بەدڵی نەبێت جا یان بە هۆی ڕق بێت یان حسادەت بەمەش لەسەر ئەم لێکدانەوە خەوەکە دێتەجێ، یان توشی دڵتەنگی و نارەحەتی ئەکات ..................

ئەم خاڵەیان زۆریـــنە تێی کەوتون چونـــکە ، کە خەوێک ئەبینن ڕاستەوخۆ دونـــیا پـــڕەکـــەن ئـــەم خـــەوە خـــۆشـــەم بـــیـــتـــنـــیوە ؟؟

## دووەم : لەکاتی بینینی خەوی ناخۆش دا

هەر ئەبی سعید الخدری ڕیوایەتی کردووە بەڵام سەرەتاکەم پچڕاندووە :

وَإِذَا رَأَى غَيْرَ ذَلِكَ مِمَّا يَكْرَهُ، فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَلْيَسْتَعِذْ مِنْ شَرِّهَا، وَلَا يَذْكُرْهَا لِأَحَدٍ ؛ فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ ". صحيح بخاری ، سنن الترمزی ، مسند احمد

واتە :گەر خەوێک بینرا ناخۆش بوو حەزت پێی نەبوو ئەوا لە شیطانەوە بۆیە با پەنا لە شـــــەڕی بــــگــــرێــــــت و لای کــــەس باســــی نەکات هیچ زیانـی نابێت .

وە هـــــەروەهــــا :

أَبَا سَلَمَةَ يَقُولُ : لَقَدْ كُنْتُ أَرَى الرُّؤْيَا فَتُمْرِضُنِي، حَتَّى سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ يَقُــولُ : وَأَنَا كُنْتُ لَأَرَى الرُّؤْيَا تُمْرِضُنِي حَتَّى سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ : " الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ مِنَ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يُحِبُّ، فَلَا يُحَدِّثْ بِهِ إِلَّا مَنْ يُحِبُّ، وَإِذَا رَأَى مَا يَكْرَهُ، فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ، وَلْيَتْفِلْ ثَلَاثًا، وَلَا يُحَدِّثْ بِهَا أَحَدًا ؛ فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ ".
صحيحين

واتە : أبو سلمه بن عبدالرحمن یەکێکە لە تابعیە گەورەکان دەڵێ : جاری وا هەبوە خەوی وا ناخۆشم بینیوە نەخوشی خستوم تا گوێم لە ابو قتادە بوو گوتی منیش وام لێهاتوە تـا گوێم لە النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو فەرمووی: خەوی چاک و خۆش لە الله وەیە گــەر هــەر یەک لە ئێوە خەوێکی خۆشی بینی با باسی نەکات تەنیا لای کەسانێك کە خۆشی ئەوێن وەگەر خەوێکتان بینی دڵی تەنگ کردن و حەزتان لێی نەبوو پەنا بگرن بە الله لێی لە شەڕ و خەراپەی وە شەڕی شیطان سێ جار تف بەلای چەپ ڕووکات وە لای هیچ کەسێ باسی نــــەکـــــات ئــــــەوا زیــــانــــی پــــێ نــــاگــــــەیــــەنــــێــــت .

لەم فەرمووودانە پێمان دەڵێت :

1 ) خەوی ناخۆش نابێت بەهیچ جۆرێ باس بکرێت پێچەوانەی خەوی خۆشە چونکە ڕووئـــــــــەدات ئــــــەمـــەشـــــیـــــان زۆریـــــنـــــەی گـــوێی پێنـــــادەن .

2) ئەبــــــێـــت هــــــەســـتــــی پەنا بگریت بە الله لە شەڕ و خەراپەی شیطان .

3 ) سێ جار تـــــف ڕووکـــــــەی ئەم کـــــات هیچ زیانێـــــکت پێ ناگــــــات .

# بینینی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەخەودا

زۆر کەس ئدیعای ئەوە ئەکات کەوا خەوی بە پێغەمبەرەوە بینیوە ئایا خەو بە پێغەمبەرەوە ئـــەبینرێت ؟ وە زۆر کـــەس پێیان وایـــە کـــەوا شیطان خۆی وا لێئەکات ؟ ...

بۆ وەڵامی ئەمەش ئەگەڕێینەوە ناو فەرموودەکان :

1 ) مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَةِ، وَلَا يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِي. صحيح البخارى

واتە : هەریەك من لە خەودا ببینێت ئەوا وەك بینینی ئاساییە چونکە شیطان ناتوانێت بێتە سەر شێوەی من .

2 ) "مَنْ رَآنِي فَإِنِّي أَنَا هُوَ، فَإِنَّهُ لَيْسَ لِلشَّيْطَانِ أَنْ يَتَمَثَّلَ بِي " سنن الترمزى

واتە : هەریەك من لە خەودا ببینێت ئەوە منم چونکە بۆ شیطان نیە بێتە سەر شێوەی من .

3 ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ، سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ : " مَنْ رَآنِي فَقَدْ رَأَى الْحَقَّ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَكَوَّنُنِي . صحيح البخارى، كتاب التعبير، سنن أبن ماجه، صحيح أبن حبان. مسند أحمد بن حنبل

واتە : هەریەك من لە خەودا ببینێت ئەوا حەقی بینیوە چونکە شیطان ناتوانێت بێتە سەر شێوە و ڕووخساری منەوە .

ئەمانە کۆمەڵێك فەرموودەن کە ئەوەمان بۆ ڕوون ئەکەنەوە بینینی پێغەمبەر لە خەودا حەقە و ڕەوایە وە بگرە موژدەیە ، چونکە نایەتە خەوی هەموو کەسێک گەر موتەقی نەبێت وە ئایا هـــــەموو بینیـــــــــنێـــك پێغـــەمــــبــــەرە صلى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ ..

لە فتح الباری ، ابن حجر ، دەڵێـــــت : ٱبن سيرين رحمه الله : گەر بهاتایە بیـــگووتبایە خەوم بە پێغەمبەرەوە بینیوە پێی دەگووت بۆم وەسف بکە ئیـــــنجا گـــــەر هەمان ئەو سیفەتانەی کە هاتوون لەسەر وەك ئەو بوایە دەیگووت : تۆ حەقت بینیوە گـــەرنا دەیگووت : نەتبینیوە ....

---

کەواتە مەرجە بینینە هەمان سیفەتی پێغەمبەر بێت

کە هاتوون بە صحیحی لەسەری لەسەر خولقیەتیەوە .

---

# گەورەترین درۆ

یەکێک لەو شتە مەترسیدارانەی کە هاتوون لەسەر گەورەترین درۆ بینینی و گێڕانەوەی خـــەوێـــکــــە بە چـــاو نەیبیـــنێت بڵـــێـــیـــت : بینــــــیـــومە ...

وەك لـــــــە صـــحـــيـــح البـــخـــارى ، مســـنـــد احـــمـــد هـــاتــــــــووە :

عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : مِنْ أَفْرَى الْفِرَى أَنْ يُرِيَ عَيْنَيْهِ مَا لَمْ تَرَ .

ابن عمر دەڵێت : رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی : گەورەترین درۆ ، واتە : ( كذب العظيم اكذب الكذب ) وەك لە فتـــــح البـــــارى هــــــاتــــــــــووە :

أفرى " أفعل تفضيل، أي: أعظم الكذبات، و " الفرى " - بكسر الفاء والقصر - جمع فرية، قال ابن بطال : الــفـــرية: الكــذبـــة العــظيمـــة التـــي يتـــعـــجـــب منهـــا .

وەکـــــ بــڵــێــيــت :درۆيـــــەکی زۆر گــــــەورە بــێــت ماناکـــەی کە یەکێـک بڵـــێــــت : ئـــەم خــــەوەم بینـــیوە بـــەڵام لەحقیقـــــەت نـــەی دیبــــــێــت .

---

کەواتە : گێڕانەوەی خەوێك بەدرۆ سزای زۆر گەورەیە بۆیە وورپابن . !!

---

# التعبير الرؤيا ، لێكدانەوەی خەو

گرنگـترین و هەسـتـیـار ترین بـەش لە باسی خەودا لێكـدانـەوەیە

ئـایـا هـەموو كـەس ئەهـلی ئـەوەیـە خـەوت بۆ لێـكداتـەوە ؟

وە ئایـا خـەو پـلە و پـایـەیی الله یـە بە كـێی بـوێت ئەیـدات ؟

قـال الله تـعـالی :

واتە : لـێـكـدانـەوە و تـعـبیری خـەومـان فـێـركـرد .

كـەواتـە ، علـمـێـكـە الله بـەكێـی بـوێـت ئـەیـبـەخشێـت .

وەك ابن سیرین كـە لـە خـەو لێـكـدانەوە زیرەكـیەكی بێ وینـەی هـەبوو ..

بـۆیە لە سنن الترمزی هـاتـووە : لَا تُقَصُّ الرُّؤْيَا إِلَّا عَلَى عَالِمٍ أَوْ نَاصِحٍ .

واتـە : خەو مەگێڕنەوە تەنها لەی كەسانی شارەزاوە نەبێت ، عالم بێت ، بە تعـبیر .

چونكە ، خەو و تعبیری خەوەكە وەک مشرق و مغرب لێک دوورن كە دواتـر هـەندێ

نـمـوونـەی لـەسـەر ئـەهـێـنـمـەوە ان شاء الله تعالى...

بۆیە وا چاكە خەو لای كەسانی عالم و موحید و لە خواترس بێت ، چونكە ، وەک خۆی

تعبیری ئەكات وەک لە باسەكانی پێشوو باسمان كرد خەو كە ئەبینرێت معلق ئەبێت

لەسەر سەری خاوەنەكەی تا ئەو كاتەی باس ئەكرێت كە باسكرا ڕووئەدا وەک كاتێ كە

دوو زیندانیەكە خەوەكانی خۆیان بۆ یوسف گێڕاوە ئەمیش بۆی تعبیر كردن،ئینجا پێی

گووتن : قال الله تعالى : (قُضِيَ الْأَمْرُ الَّذِي فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ) ئیدی شـتەكە بـڕاوە ڕوو

ئـەدات بـۆیـە ڕووشـی دا یـەكـێـكـیـان ئـازاد بـوو ئـەوی تـر لـە خاچ درا .

## هەنـدێـك نـموونەی تعـبـیری خــەو

## كە لە فەرمووده صحیحەكانی  وەك بخاری و مسلم و ابوداود و ترمزی ــدایـە :

### 1 ) شـیـــر خـــواردن لە خـــەودا

عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَقُولُ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ، أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ ، فَشَرِبْتُ مِنْهُ، حَتَّى إِنِّي لَأَرَى الرِّيَّ يَخْرُجُ مِنْ أَطْرَافِي، فَأَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بْنَ الْخَـطَّابِ ". فَقَـالَ مَنْ حَــوْلَهُ : فَــمَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَســُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ : " الْعِـلْمَ ".

واتـە  : رسول الله دەڵێ لە خەودا جامێک شیریان بۆم هێنا و لێم خواردەوە تا بەتەواوی دەرچوو و ئینجا ئەوەی ماوە دام بە عمر گوتیان چۆنت لێكداوە، فەرمووی : علم ،زانست

واتە : خواردنی شیر لە خەودا علم ــە وەك لە شەوی ئیسراو میعراجیش سێ جامیان بۆ هێنا شیر و خمر و هەنگوین شیرەكەی خوارد جبریل گــوتی : الحــمدلله الذی هـداك للفطرة .

### 2) قــمـــیـــص لـــە خـــەودا

رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەڵێت : من خەوتبووم خەڵكیان پێ نیشان دام جلیان لەبەر بوو هەریــەكە و جلــــەكەی درێژی جـــۆرێک بــوو واتە : كورت و درێژی عمــرم بیـنـی لەدوای ئەخــشـــــــا، گـــوتـــیـــان : چـــۆنـــت لێكــداوە گــوتی : الدین .

### 3) أم العلام الله لێی ڕازی بێت دەڵێت : لە خەوم ـدا عثمان بن مظعون ـم بینیی كانـیەكی لا هــەڵــدە قـــوولا، بــۆ پێغەمبەرم باس كرد گوتی : ئـــەمە كــردەوەكــانیـەتی ،

واتـە: كــانی و ڕووبــار لە خەو ـدا كـــــردەوەی چـــاكـــەی ئیــمانــداره .

4) بینینی کۆشــک لە بەهــەشـــت وەک بینـــینی کۆشــکی عـمــر کە ئافرەتێک تــێــیـدا دەســت نــوێــژی ئـــەشــوشـــت بـــشــارەتــە و مـــوژدەیـــــە .

5) خەوی یوسف کە خۆر و مانگ سجدەیان بۆ برد ئەوەبوو : لە کۆتایی دا باوکـی پێــی شاد بۆوە کەوا سجدەی شکوری بۆ برد ئینجا گوتی ئەمە تأویلی خەوەکەم بوو ئەی باوکە .

6) بینینی حەوت مانگا وەک لە زەمەنی یوسف کە لێکی داوە بە حەوت ساڵ و وشکە ســـاڵـــی و حــــەوت ســــاڵ هــــــات .

7) خەوی زیندانیەکان گەڵ یوسف علیه سلام کە یەکێکیان نان لەسەری بوو باڵندە لێی ئـــەخـــوارد یـــەکـــێکـــیان شـــەڕابـــی ئـــــەدا بــە پاشا ......

---

تعبیر زۆرە گەلێک بەڵام لێکدانەوە و شیکاری فضل ـە لە لایەن الله وەیە

---

# بەگشتی خەو چەند جۆرێکە

خـــەو ســـێ بـــەشـــــە :

1) ئەوەیە کە لە نفسی مرۆڤ ـدایە واتە :

بـــیـــرکـــردنـــەوەکانی ڕۆژانـــەی و ئەم خـــــەیـــالانـــەی بـــە مـێشکی دا دێت .

2) خـــەوی حەقـــە کـــە ئیـــمـــانـــدار ئـــەبیـــیـــنـێـــت موژدەیـــــــــە .

3) وەسوەسەی شیطانە بۆ دڵتەنگ کردنی ئیمانداران ، لە خوارەوە عەرەبیەکەم ئاماژە پێکردووە :

---

وأخرجه الترمذي والنسائي من طريق سعيد بن أبي عروبة عن قتادة عن ابن سيرين عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: " الرؤيا ثلاث، فرؤيا حق، ورؤيا يحدث بها الرجل نفسه، ورؤيا تحزين من الشيطان "، وأخرجه مسلم وأبو داود والترمذي من طريق عبد الوهاب الثقفي عن أيوب عن محمد بن سيرين مرفوعا أيضا بلفظ: " الرؤيا ثلاث، فالرؤيا الصالحة بشرى من الله "، والباقي نحوه فتح البارى ...

---

هەندێ خەو هەیە پێی دەوترێت : تلاعبی شیطان واتە : یاری پێکردن لە لایەن ابلیس .

- وەك : لە فەرموودە واردە یەکێک هاتە لای رسول الله صلی الله علیه وسلم گوتی : لە خەوما یاریـم بە سەری خۆم ئەکرد ئەمیش فەرمووی : پێویست ناکات تلاعبی شیطان بۆ من بگێڕنەوە . !!

- هەروەها خەوی ڕۆژ و خەو بینینی شەو هەمان شتن وەک ابن سیرین دەڵـێـت :

خـــەوی ڕۆژ و شـــەو وەکــــ یـــــەک وان ... صحیح بخاری، کتاب التعبیر

- هەروەها لە فەرموودەی صحیح واردە کە بخاری و مسلم و اصحاب السنن هێناویانە ، لەکاتی نزیکبوونەوەی قیامەت خەوی ئیماندار درۆ دەرناچێت !! بەڵکو هەمووی ڕاست دەرەچێت .

- هەروەها ابن عمر دەڵێت : رسول الله صلی الله علیه وسلم ڕۆژانە بە هاوەڵانی دەووت : کێ ئەمشەو یان ئەمڕۆ خەوی بینیوە با بێت بۆی لێک دەمەوە ئینجا بۆی لێک ئەدانەوە بۆیە منیش حەزم ئەکرد خەو ببینم ..!! تا بۆی بگێڕمـــەوە تاوەکو ڕۆژێکیان خەوی بینی دوو کەس بردیان جهنم ـیان پێ نیشان دا هاواری کرد و پەنای پێ گرت گوتیان : مەترسە تۆ کــەســێــکی چـــاکـــی گــەر نـــوێژەکـــانت زیاتــر بکــەیــت . صحیح بخاری

---

ئەمە کورتەیەك ئەمەش دەلالەتە لەوەی خەو گرنــــگی زۆری پێــدراوە لــەم دینە بــوو لە خــەو احــــکامەکانی جــۆر و مانـــا و مەتـــرسی و گرنــگی خــەو

---

ولله الحمد والمنة

وصلى الله وسلم على نبينا محمد ، وعلى اله وصحبه وسلم

## کــــــۆتــــــایـــــی

نوسینی : لیکولەر ابی عبدالله کوردستانی